بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

خوێنەری ئەزیز، لەم کتێبەدا بە کۆمەڵێک کورتەڕامان ئاشنا دەبیت کە وات لێ دەکەن گەشبین تر بیت لە ژیان ، وات لێدەکات هیوات زیاتر بێت بە خودای میهرەبان، ئەوە بزانە خۆشی و بەختەوەری هەمیشە لە دواوەی دەرگاکە وەستاوە تەنها تۆ ئەبێت بزانی کە کلیلە ڕاستەکە هەڵبژێری بۆ کردنەوەی دەرگاکە،یەکێک لە کلیلەکان بریتییە لە ئومێد بوون بە خودا و پاڕانەوە و نزاکردن لەو زاتە مەزنە، پێویستە تۆوی هیوا و ئومێد بە خودا لە دڵتدا بڕوێت و بەردەوام بێت لە گەشە کردن و هەمیشە ئاوی بدەی و ڕێگە بگری لە سیس بوونی، ئەوەش بە یادکردنەوەی خودا و ئارامگرتن بۆ بەخششەکانی دەبێت، هیوادارم نوسینەکانی نێو ئەم کتێبە هۆکارێک بن بۆ گەشانەوە و گەشەکردنی تۆوی ئومێد و هیوا لە دڵتدا.

أنا عِنْدَ ظَنِّ عَبدِي بي.

من لەجێی گومانی بەندەکەمم بەمن.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

گەورەترین چاکەیەک لەگەڵ خۆمانی بکەین خوداش لە خۆمان ڕازی بکەین بە چاوی حیکمەت ڕوانینە لەهەر کارێک کە خوا بۆمان پێش دێنێت و گومانی باش بردنە بە خودا لە سەختترین کاتەکانیشمان.

*** *** ***

إِنَّ مَعَ العُسرِّ يسّرًا

لەدوای  هەر ناخۆشییەک خۆشییەک بەڕێوەیە.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

هەمان ئەو خودایەی ئاگای لە کەوتنە خوارەوەی گەڵایەکە، ئاگاداری نزاکانی تۆشە کە چەندە بە تامەزرۆیی و بە ئومێدەوە نزا دەکەی.

*** *** ***

هوَّ عليَّ هيِّنٌ

ئەو شتە لەلای من ئاسانە ئیتر خەمی چیتە.

*** *** ***

میهرەبانی خودا ئەوەندە زۆرە کە بەسەدان ساڵی تەمەنت ناتوانی بیریشی لێ بکەیتەوە.

*** *** ***

وَعَسَى أَن تَكْرَهواْ شيئاً وَهُوَ خَيرُ لَكُم وَعَسى أن تُحِبُّوا شَيئاً وَهُوَ شَرُّ لَّكُم وَاللّهُ يَعْلَمُ وَانتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ

لەوانەیە شتێکتان پێ ناخۆش بێت کەچی خێر لەوەدایە، وەلەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت کەچی شەڕ لەوەدایە وە خودا چاك و خراپی ئێوە ئەزانێ و ئێوە نایزانن.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

بیربکەوە دایك و باوکت چەندە میهرەبانن، لەبیرت بێت خودا زۆر میهرەبان ترە.

*** *** ***

ئەگەر شتێکت بەخودا سپارد بە یەقینێکی تەواوەوە ئەوا بزانە بۆت هاتۆتە دی.

*** *** ***

یەكێك لە مەزنترین میهرەبانییەكانی خودا بەرامبەرت
ئەوەیە كە تۆی بە مرۆڤ دروستكردووە.

*** *** ***

خودا به جۆرێك میهرەبانە كە بەهەشتی وەك پاداشت بۆ ئامادەكردووی لەبەرامبەر ئەو چاكانەی كە بەرامبەر بە خۆت ئەنجامیان دەدەی.

*** *** ***

وای دابنێ هەموو هیواکانت کەوتۆتە بیرەکەی پێغەمبەر یوسف، یەقینیشت هەبێ بەهۆی دوعاکانت خوای گەورە دەیهێنێتە دی.

*** *** ***

مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى

پەروەردگارت وازى لێ نەهێناویت و لێت دڵگیر نەبووە.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

له چ یاسا و ڕێسایەك بوونی هەیە بەهەوڵدانی کەم ئەنجامی زۆر وباش بەدەست بهێنی، جگەلە یاسای خودا؟

له یاسای خودا وەهایه کە زەردەخەنەیەك بکە لەبەرامبەریدا دە چاکەت دەستکەوتووە.

*** *** ***

لاَّ يَضيلُّ رَبِّي وَلاَ يَنّسى

پەروەردگارم هیچ شتێکی لێ ون نابێ، و هیچیشی لەبیر ناچێت.

*** *** ***

یەک تۆز بیر لە میهرەبانی خودا بکەوە، بیر لەهەموو ئەو کردار و ڕەفتارە ناشرینانەت بکەوە کە ڕۆژانێک ئەنجامت داون و خوداش پەردە پۆشی کردوون.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

وَإذا سَألَكَ عِبَادي عَنّي فَإنّي قَرِيب

هەردەمێك بەندەكانم دەربارەی من پرسیاریان لێ كردیت، من نزیكم.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

خودا ئەو زاتەیە هەرگیز ماندوو نابێ لە ڕازەکانت، بڕۆ لەگەڵ ئەو بدوێ چیت داوە لە بەندەکانی.

*** *** ***

ئەگەر دەتزانی خودا چۆن بیسەری دوعاکانتە شەرم دای دەگرتیت، لەوەی گومانت بردووە وەڵامت ناداتەوە.

*** *** ***

"الله" دەزانێت کە تۆ ماندووی، دەزانێت کە هەوڵدەدەی،دەزانێت کە قوڕسە بۆت، بەڵام دەزانیت کە خوا گیان قەت ناتخاتە بارودۆخێك کە نەتوانی مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت.

*** *** ***

خودا هەمیشە کاتی هەیە بۆتۆ، هەرکات ویستت ئەتوانی بچی و کێشەکانتی بۆ باس بکەی.

*** *** ***

-دڵتەنگیت؟

-بێزاریت؟

-ماندوویت؟

-سەختە بۆت؟

*تەنها بیر لەوە بکەرەوە هێزی هەموو گەردوون ئاگای لە هەموو هەستەکانتە، ئیتر خەندەیەك بکە.

*** *** ***

بۆ کەسی ژیر دەربڕینێکی سادە بەسە، ئەو لەلای خۆی لەشێوەی واتایەکی گەورە دەیخولقێنێ.

*** *** ***

ئەوێك لە دایكێك میهرەبانتر لە باوكێك پەناهەندەتر، وە لەهەر كەس بە تواناتر، هەموو كارەكانت بە خودا بسپێرە ئەو هەرگیز بەندەكانی بێ ئومێد ناكات.

*** *** ***

أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ

ئایە خودا بەس نییە بۆ بەندەکەی؟.

*** *** ***

وَكَفَى  بِاللَّه عَلَيمًا

هەر ئەوە بەسە،کە خودا دۆخی بەندەکانی دەزانێت.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

ئەی مرۆڤ هۆکاری ڕزگاریت سێ شتە:بەرگەگرتن، باش بیرکردنەوە، پشت بەستن بە خودا.

*** *** ***

میهرەبانی خودا زۆر لەوە گەورەترە کە مرۆڤەکان بە نەهاتنەدی ئارەزوویەکی بچووکیان نائومێدبن.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

دڵنیابە میهرەبانی خودا زۆر فراوانترە لە ناڕەحەتیەکانی ژیانت.

*** *** ***

میهرەبانی و بەخشندەیی خودا دواناکەوێت بەڵکو لە کاتێکی گونجاودا دێت.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

هیچ شتێك دوا نەكەوتووە تەنها پەروەردگار كاتی گونجاوی خۆی بۆ داناوە.

*** *** ***

لەبەردەم میهری خودادا تاوانەکانت بە زۆر مەزانە و بێ ئومێد مەبە، هیچ کەسێك هێندەی خودا بە تەوبەکەت شاد نییە.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

پێش ئەوەی بیر لە چۆنییەتی ڕزگار بوون بکەیتەوە باش بیرت بێت:

یارانی ئەشکەوت هەرگیز خەیاڵی ئەوەیان نەکردبوو ڕزگاربوونیان لەڕێگەی خەوتنەوە دەبێت.

*** *** ***

ئەگەر متمانەبوون بە خودا لە دڵدا ون نەبوو ئەوا ئارامی لە دڵدا نیشتەجێ دەبێت.

*** *** ***

پێش ئەوەی بخەوییت لەگەڵ خودادا بدوێ!

باسی خەون و ئاواتەکانتی بۆ بکە و هەر لەئەو داوای بەدیهاتنی بکە.

*** *** ***

میهرەبانی خودا زۆرلە مەحاڵەکانی تۆ گەورەترە بۆیە دودڵ مەبە.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

خاوەنی ئارامگرتنێکی بێ سکاڵا بە، یەقینت هەبێ خودا بەسەد هێندە قەرەبوت بۆ دەکاتەوە.

*** *** ***

وریابە سەختییەکان و فێڵەکانی شەیتان میهرەبانی خودات لەبیر نەبەنەوە.

*** *** ***

سکاڵای خەمەکانت لە سوجدەدا باس بکە چونکە کەس لە خودا دادپەروەرتر نیە.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

خودا هیچ شتێکت لێ ناسەنێت هەتا باشترت بۆ دانەنێت.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

موعجیزەکانی خودا لەپڕێکدایە باوەڕتان بە پلانەکانی هەبێت.

*** *** ***

کۆڵ مەدە لە نزاکانت پەروەردگادت ڕۆژێك هەر وەڵامت دەداتەوە ئەو خاوەن بەڵێنی هەقە.

*** *** ***

فَلاَ يَحْزُنكَ قَوْلُهُم

باقسەکانیان غەمبارت نەکەن.

*** *** ***

کێشەکان ڕەنگە وەکو کەشتی گەورە بن، بەڵام خودا چارەسەرێکی بۆ دەنێرێت هێندەی ئۆقیانووس فراوان بێت.

*** *** ***

هەرکات هەستت کرد دەکەویت ئەوا سوجدە ببە تا بەهێزتر هەستیتەوە.

*** *** ***

هەوڵبدە هەموو بەربەستەکان وەکو ڕێگایەك بۆ سەرکەوتن ببینی.

*** *** ***

قَد جَعَلَها ربي حَقاً

خوداى من كردى بەڕاستى و هەقیقەت.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

خودا هەرگیز ئومێدێك ناخاتە دڵتەوە ئەگەر نەیەوێت ئەو شتەت پێ نەبەخشێت كە ئومێدت بۆی هەیە.

*** *** ***

متمانەت بەخودای گەورە هەبێت  دواتریش بەخۆت ئەوەی ئەتەوێ بەدەستی دەهێنی.

***   ***   ***

هیچ ڕێگایەك سەخت نییە ئەگەر بەناوی خوداوە دەست پێ بکەی.

*** *** ***

كُن فَيَكُون

خودا بیەوێت هەموو شتێك دەبێت.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

پەروەردگارت نە جێی هێشتووی نە لەبیریشی کردووی .

*** *** ***

بەدڵتەنگیەکەت ڕوداوەکان ناگۆڕێن، نزا بکە و یەقینت هەبێ بەوەڵامدانەوەی خودا ئەوکاتە چاوەڕێی گۆڕانکاری بکە.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

کە دڵ پڕ بوو لە موحیبەتی خودا،ئیتر شوێنێك لەدڵدا نامێنێتەوە بۆ بێهیوایی.

*** *** ***

إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ

بەڕاستی خودا ئەوانەی خۆشدەوێت کە پشتی پێ دەبەستن.

*** *** ***

بیرکردنەوەی زۆر و دڵەڕاوکێی زۆر هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێت، چونکە خودا دیاری کردووە کەچی ڕودەدات.

*** *** ***

لەبیرت بێ کە خەیاڵەکان ئامانەتی نزاکانن، وە نزاکانیش ئامانەتی خودان.

*** *** ***

گەر خێر بوایە، دەبوو

گەر خێر بووایە،بەردەوام دەبوو

گەر خێر بووایە،دەهات

گەر خێر بوایە، دەمایەوە

*خودا دەزانێت و ئێوە نایزانن*

*** *** ***

مەهێڵە تاکە غەمێك هەزاران نیعمەتت لەبیر بباتەوە.

*** *** ***

بەنزاكردن موعجیزەكان دەخوڵقێن نەوەك بە دڵتەنگی.

*** *** ***

خودا کاتێك تۆ ڕووبەڕووی زەلەی میهرەبانی خۆی دەکاتەوە فەرمانت پێ دەکات کە بگەڕێیتەوە و ئاگادارت دەکاتەوە بۆ وازهێنان لە ڕابواردنە کاتییەکان.

*** *** ***

لەگەڵ کات نا لەگەڵ نزا دێت ئەوەی چاوەڕێی دەکەیت.

*** *** ***

خودا بەو گەورەیی و دەسەڵاتەی خۆیەوە شەرم دەکات لە بەندەیەکی ئەگەر دوای سێ جار دەست بەرزکردنەوە بۆ نزاکردن و پاڕانەوە لە خودا وەڵامی نەداتەوە ، تۆی بەندەی بێ دەسەڵات چۆن لە ڕووت دێت گومانت لە گیرابوونی نزاکانت هەبێت.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

دڵنیابە ساتێك دێت كە خودا بۆت دەكات بە ساتی شیرینی حەسانەوەت لە سایەی تاڵی ئارامگرتنت.

*** *** ***

هەر شتێك كە لەژیانتدا ڕوودەدات لە ئێستادا باش بێت یان خراپ لە داهاتوودا سوودی بۆت دەبێ، بۆیە هەرگیز بەختی خۆت تاوانبار مەكە، ئیمانت بە خودا هەبێت.

*** *** ***

-ئایە خودا ئاگای لە منە؟

-بەڵێ.

-ئەی بۆچی ئەوەم پێ نابەخشێ کە داوای دەکەم؟

-چونکە دکتۆر ئەو دەرمانەت ئەداتێ کە چارەسەرە، نەك ئەو دەرمانەی تۆ پێتخۆشە.

*** *** ***

وَاصّبِرّ لِحُكّمِ رَبِّكَ فإِنَكَ بِأَعّيُنِنَا

بەسەبر بە بۆ ئەو بڕیارەی خوا بەسەرتدا دەیدات، بەڕاستی تۆ لەژێر چاودێری ئێمەدایت.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

ڕەنگە ئەو نەهامەتی و ناڕەحەتیەی کە حەزت لێی نییە
بەرەو چارەنووسێکی وەها جوانت ببات کە هەرگیز خەونت
پێیەوە نەبینیوە.

*** *** ***



# خودا

## دەفەرموێت: (وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ)

قورئان شیفایە بۆ ئەوەی لەنێو دڵ و دەرونتان دایە!
نافەرموێت دەرمانە!
چونکە دەرمان یان دەبێتە هۆی چارەسەر یان نابێت،
بەڵام قورئان بەتەواوی دەبێت!